بسم الله الرحمن الرحيم

# سەری پوتین لە کریملن !

د. خالد سعيد

لە ڕاستیدا بە نیازی ئەوە نیم کە باسی "گریگۆری راسبوتین" ی قەشەی سەرگەردانی سەردەمی روسیای قەیسەری بکەم، کە لە کۆتا بە کوژراوی لە دەریاچەی "نیڤا" دا گیانی لەدەستدا، بەڵکو باسی ئەو کەسە دەکەم کە نەخشەڕێژانی سیاسەتی ئەمڕۆ لە ڕوسیا بە "سەر"ی پوتین یا "عەقڵی پوتین" ی ناو دەبەن، وەك یەکێك لە کاریگەرترین سیاسەتمەدارانی سەر بیر وعەقڵی سەرۆکی ڕوسی، ئەویش پرۆفیسۆر وفەیلەسوف وتیۆری نووسی سیاسی "ئەلکساندەر دوگین"ــە.

سەیرە کە سەرەڕای توانا سیاسییەکەی بۆتە عابیدێکی ئەرثۆدۆکسیش، دوای گرتنەبەری ڕەوتی ئەرثۆدۆکسی خۆپارێز وگەڕانەوەی بەرەو قووڵایی ئاینیی قەومیەتی ڕوسییەوە، لە هەمان هێڵی گەڕانەوەی بەرەو ڕەگەکاندا. بۆیە دوای ئەوەی یەکێك لە بەرهەڵستانی ڕژێمی سۆڤێتی کۆمونیستی بوو لە کاتی خوێندنی زانکۆیدا، بەو ڕادەی کە بە ئەندامێکی کۆمەڵەی "بامیات"ی نەتەوەیی ئۆپۆزیسیۆن ناسرابوو، بەڵام ڕووخانی یەکێتی سۆڤیێت ودوابەدواکانی کردیانە بەرهەڵستێکی سەرسەختی ڕەوتی لیبرالی ڕۆژئاوایی سەردەمی یلتسین، یاخود گەڕانەوە بەرەو ئەوەی دەتوانین بە بەلشەفیەتی نیشتیمانی بیناسێنین، کە لە ڕاپەڕینی ١٩٩٣ دا بەشدار بوو، وپاشان وەك یەکێك لە سەرسەخترین بەرهەڵستان؛ حیزبی بەلشەفی نەتەوەیی دامەزراند.

لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخی ڕووسیاو، وبڵند بوونەوەی پوتین لە دەسەڵاتداو لە هەمان ئەو کاتەی کە میحوەری ئەنگلۆ-ئەمریکی تووشی گۆماوەکەی ئەفغانستان بوو لە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەردا، دوگین تیۆری ئەوراسی خۆی وەك ژێرخانێکی ئایدۆلۆژی یاخود دیدێکی سیاسی

تازەی ڕووسیا پێشکەش بە دەسەڵات کرد، کە لە کتێبی "ڕەوتی ئەوراسی وەك بیرێکی نیشتیمانی" دا دەیخاتە ڕوو، ودیار بوو کە هەوڵەکانی لەوەدا بوون پاڵ بە ڕووسیاوە بنێت بۆ ئەوەی لە دیاریکردنی سیماو سروشتی ڕژێمی جیهانی هاوچەرخ دا بەشدار بێت، وڕکابەری تاك جەمسەری ئەو ڕژێمە بکات.

ئەلیکساندەر دوگین کە خاوەنی دوو بڕوانامەی دکتۆرایە، دانەیەکیان لە فەلسەفەو ئەوەی تریان لە زانستە سیاسییەکانداو، خاوەنی زیاتر لە ٣٠ کتێبە کە گرنگترینیان "ئەوراسیەتی تازە" و "بنەماکانی جوگرافیای سیاسی" ین وهەروەها داهێنەری "تیۆری سیاسی چوارەم"ە، بە هەمان شێوە ویستوویەتی قۆرخکردنی زانستەکانی بەڕێوەبردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە لایەن تیۆری نووسەکانی میحوەری بەرامبەرەوە بشکێنێت؛ وەك هەنتینگتۆن، وبرجنسکی، وجۆزێف نای، وکێنێث والتز وئەوانی تر .. بەڵکو ویستوویەتی چەمکە فەلسەفییە سەرەکییەکانی تیۆری نووسانی ڕۆژئاوا هەڵوەشێنێتەوە، کە بریتین لە پێش نوێگەری ونوێگەری ودوای نوێگەری، بۆیەش کتێبی "ڕێچکەکانی دوای فەلسەفە"ی نووسیوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە نەتەوەی ڕوسی قەت لەگەڵ بە ناو نوێگەری وەك بیرێکی بێگانەی ڕۆژئاوایی نەسازاوە، بەڵکو هەردەم لە قۆناغی پێش نوێگەریدا ماوەتەوە، تەنانەت لەئاستی کەسایەتییە سیاسی وڕۆشنبیرییەکانیدا.

تیۆری "ئەوراسی" دوگین کە لە نامەی زانستی خۆیدا بە ناونیشانی "تیۆری سیاسی چوارەم"دا دەیخاتە ڕوو، ئایدۆلۆژیای کریملن وکەسایەتییە دەسەڵاتدارەکانی ڕووسیا بەرجەستە دەکات، وەك بەدیل وجێگۆزینی سێ تیۆرییە باوەکانی سەدەی ڕابردوو: کە بریتین لە شیوعیەت وفاشیزم ولیبرالیەت. پوختەی ئەم میتافیزیکە بەلشەفییەش بریتییە لە دووبارە پێکهێنانەوەی "ئیمپراتۆریەتی ئەوراسی"، لە ڕێگەی پتەوکردنی هێزی جیۆسیاسی ڕووسیا وتەواوکاریی میحوەرەکانی لە پشتێنی ئەوراسی، وپشتێنی پاسیفیکی، وپشتێنی ئۆرۆ-ئەفریقی دا (کە جیهانی عەرەبیش دەگرێتەوە). بەو جۆرەی کە جەمسەرێکی جیهانی ڕکابەری میحوەری ئەمریکی تاك جەمسەرانە بێت‌و، بە مانایەکی تر بڵێین، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێتە گۆڕەپانی پێکدادانی جیۆپۆلیتیکی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانداو، سەرکەوتنی ڕووسیا لەم شەڕەدا پێویستییەکە بۆ مانەوەی وزیادە گوزەرانێك نییە.

پوختەکەشی ئەوەیە کە ڕووسیا کاتێك بە هەردوو قۆناغی شیوعیەت ولیبرالیەت دا تێپەڕیوە، پێویستە قۆناغی گۆڕانێکی تازەی جیهانی لەسەر بنەمای بەرزییەکی ئیمپراتۆری ئەوراسییەوە دامەزرێنێ، واتا بیناکردنە سەر کۆمەڵە ژێرخانێکی ئەخلاقی تازەی بەدیلی بەها مادییە بەرخۆرییەکان، بەڵکو سەرلەنوێ بە پێی ئەم بنەمایەوە دەستپێکەکانی ململانێی جیهانی لە شەڕی ساردی پێشوودا شیکاتەوە، وەك ململانێیەکی جیۆپۆلیتیکی بە ژێرخانێکی جوگرافی لە نێوان هێزە دەریاییە ئەنگلۆ ئەمریکی وهێزە وشکاییە ئەوراسییەکان دا، نەوەك لە نێوان کۆمونیستی یاخود شیوعیەت وسەرمایەداری دا، ئەوەی دەتوانم وەك گەڕانەوە یاخود هەڵگەڕانەوەیەکی بەرەو جوگرافیاوە ناو بنێم وەك جێگوزین وبەدیلێك وبە هەمان شێوە بیانوویەك بۆ سیاسەتە دەرەکییەکانی ڕووسیا. ئەمەش سیاسەتە پراگماتیکەکانی پوتین ڕوون دەکاتەوە لە میانەی دامەزراندنی یەکگرتوویەکی ئابووری ئەوراسی بەرفراوان دا کە رووسیا وکازاخستان وبیلاروس وئۆکرانیا دەگرێتەوە.

یەکێتی سۆڤێت - پێشینی ڕووسیا - بە ئەندازەی یەك لەسەر چواری ڕووبەری جیهان بوو، بەڵام توانای گەیشتنی بە دەریا نێودەوڵەتییەکان نەبوو کە بریتی بوو لە کەلێنێکی جیۆسیاسی مەترسیدار، دیاریشە کەو ئەو یەکێتییە هەوڵیدا لە ڕێگەی داگیرکردنی ئەفغانستانەوە چارەسەریکات، بەڵام دووچاری شکستێکی گەورە بوو کە سەرەنجام بە هەڵوەشانەوەی یەکێتییەکە گەیشت. هەر ئەمەش وا لە سووریا دەکات میحوەری ململانێی نێوان دوو فەلسەفەی ئیدارە کردنی ڕژێمی نێودەوڵەتی بێت، چونکە سووریا کۆڵەکەیەکی سەرەکی - ولەوانەیە تاکە کۆڵەکەی - پرۆژەی ئەوراسی بێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە مۆڵگەیەکی دەریایی ڕووسی لە شاری طرطوس دا هەیە، لە هەفتەی پێشوودا ڕووسیا کردی بە مۆڵگەیەکی جێگیر.

وا دیاریشە کە کرملین - بە سەرکردایەتی پوتین وفەلسەفەی دوگین -ەوە ئامادەی بەڕێوەبردنی ململانێیەکی سەربازی درێژخایەنە لە سووریادا، نەك تەنها بۆ پاراستنی دەسەڵاتی وەك زلهێزێکی جیهانی، بەڵکو بۆ پاراستنی مانەوەی لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست ودەریا فێنکەکاندا. هەر ئەمەش هەمان هۆکاری شەڕی دژ بە جۆرجیا، وهەوڵی دروستکردنی پێگەیەکی

سەربازی ڕووسیە لە ناوچەی سیدی برانی لە میسڕ، وبەشداربوونی لە دونباس لە ڕۆژهەڵاتی ئۆکرانیاو گرتنەخۆی نیمچە دورگەی قرم، وپاشان سەربەخۆیی دونیستك ولوگانسك بە پێی ئەوەی کە پێویستییەکی جیۆسیاسین تەواوی ڕەچاوەکان دەپەڕێنێ. بۆیە ڕووسیا بەو کارەوە مانەوەی خودی خۆی مسۆگەر دەکات، دوگین دەڵێت: "ئەگەر (دونباس)مان لەدەستدا، ئەوا قرم وپاشان تەواوی ڕووسیا لە دەست دەدەین"، دریژە دەدات ودەڵێت: "بەهاری ڕووسیا بێ لە میحوەرێکی ئەوراسی لە ئۆکرانیا دا ئەستەمە، بە چاوپۆشی کردن لە شێوازەکەیەوە، ئاخۆ ئاشتیانە بێ یان نا"، یاخود ئەوەی کە بە "ئامرازی پێویستی" یا "بەڵگەنەویستی جیۆسیاسی" ناوی دەبات.

دوگین پێی وایە کە سوریا "ئامانجی دوورترە" لە ئۆکرانیا بەڵام لەو بێ بایەختر نییە، چونکە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوەی کە بە تیرۆری ناو دەبات وبە تایبەتی ئەو ڕێکخراوەی بە "داعش" ناسراوە پێویستییەکی بوونی ڕووسیایە لە دیدێکی جوگرافی سیاسی ئەوراسییەوە. لێرەدا دوگین نوقمی قووڵایی تیۆری پلان Conspiracy Theory دەبێت - ئەگەر چی خۆی دان بەوە نانێ بانگەشە بۆ ئەم تیۆرییە بکات - کە دێت وئەم ڕێکخراوە وەك دەستکردێکی ئەمریکی پێناسە دەکات تاوەکو بیانوویەك بێ بۆ دەستلێوەردانی ئەمریکا لە هەر کاتێك دا بیەوێت، بە چاوپۆشی کردن لە تەواوی هۆکار وئامرازە بابەتییەکانی بوون وپێکهاتنی ئەو ڕێکخراوەو، بەڵگە بۆ ئەمەش بە دان بە پیانانەکانی بریجنسکی دێنێتەوە لەو کاتەی کە ڕاوێژکاری جیمی کارتەری سەرۆکی ئەمریکا بوو بۆ ئەوەی مۆڵەتێکی بۆ پڕچەك کردنی موجاهیدە ئەفغانەکان دژ بە یەکێتی سۆڤیەت لێ وەرگرێ.

لەوەشدا دەگاتە ئەوەی کە ڕووسیا پێویستە شەڕێکی ڕاستەقینە لەگەڵ جەمسەری ئەتڵەسی دا بەرپاکات، لە ڕێگەی بەکاربردنی هێز لە سووریادا لە جێی دیپلۆماسیەتەوە، بە تایبەتی کە لە قۆناغی لاوازیی دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت باش بۆتەوەو هەستاوەتە سەر پێ‌و ئێستا توانای ڕوو بە ڕوو بوونەوەی سیاسەتی گەڕەلاوژەی ئەمریکای هەیە کە بۆ تێکدانی دەوڵەتە نەتەوەییەکان هێناویێتییە دی‌و، بەرلێگرتنی ئەو پرۆژەی بە "پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی

گەورە"وە ناسراوە. دوگین دەڵێت: "سوریا هێڵی دەرەکی بەرگریمانە، هێڵی دوای سووریاش لەسەر خاکی یەکگرتووی ئەوراسی وتەنانەت لە ناوەوەی یەکگرتووی ڕووسی دایە".

بۆیە پوتین پێی وایە کە بەشداریکردنی سەربازی لە سووریا، پێویستییەکە بۆ لەخۆگرتنی ئەوەی پێی وایە تیرۆرێکە لەسەر لێواری ئەم پشتێنە ئەوراسییە دا، پێش ئەوەی لە خاکی ڕووسیدا ڕووبەڕووی بێتەوە، چونکە چالاکی داعش ولایەنەکانی تر تەنها لە چوارچێوەی سووریا وعێراق دا نەماوەتەوە، بەڵکو لە ولاتانی ئاسیای ناوەڕاستیش دا وەك ئەفغانستان وتاجیکستان وئۆزبەکستان، بەڵکو لە باکووری قەفقازیش واتە لە خودی ڕووسیادا (...).

لێرەشدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕووسیا بەمە ڕێگە لە ڕووخانی زۆربەی دەوڵەتانی ناوچەکە دەگرێ لە دوای سووریاوە، بە تایبەتی ولاتانی باکووری ئەفریقا، کە لێشاوی ملیۆنها پەنابەریش بەرەو ئەوروپا دەوەستێنێت، ئەو لێشاوەی لەوانەیە بگاتە لێکترازانی سروشتی کۆمەلایەتی وسەقامگیری سیاسی لەوێدا. هەروەها پێی وایە کە ئەوروپا هێشتا وەك دیوار وبەستەیەك لەسەر سنووره باشووری ورۆژئاواییەکانی ڕووسیادا وەستاوە، هەروەك قەڵغانێکی پارێزەر بووە لە بەردەم بەرفراوان بوونی عوسمانی لە قۆناغی ڕابردوودا، بۆیە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕییە ئەگەر چی ئەوروپاش دان بەوەدا نانێت.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧